# ووتەکانی زیکۆ

**ناوی کتێب:** یەکەم جارە ئاشق بم

**بابەت:** ووتە و شیعر و چیرۆک

**نووسەر:** زیرەک جەبار عەزیز (زیکۆ)

تێبینی:- لە کاتی بردنی هەر بابەتێکم وەك ریزێك لە ماندووبوونم ناوم لەگەڵ بابەتەکە بنووسە زۆر سوپاس بردنی بابەتی نوسەرێك بێ ناوی نوسەر کارێکی زۆر ناشرینە بەڕای خۆم بۆیە لەکاتی بردنی بابەتەکانم یان بابەتی هەر نووسەرێك ناوی نوسەر بنووسی کارێکی زۆر جوانە .... "سوپاس بۆ خوێندنەوەی بابەتەکانم"

بۆ هەر ڕەخنە و پێشنیارێك دەتوانن پەیوەندیم پێوە بکەن لە ڕێگای فەیسبوك یان إنستاگرام


Facebook: Zirak Jabar Aziz
Instagram: Zirak_Jabar_Aziz



# زیرەك جەبار عەزیز (زیکۆ)

## کتێبی: یەکەم جارە عاشق بم

" باوکم ووتی هەژارین لەبیری بکە! "

بە باوکمم ووت: عاشقی کچێکم!

باوکم ووتی: کێیە ؟ کچی کێیە؟

ووتم: فلانە و کچی فلانە!

ووتی: تۆزێ وەسفی بکە!

ووتم: کچێ جوانتر لە مانگ جوانتر لە ئەستێرەکان..!

ووتی: واز لە جوانی بێنە باوکی چ کارەیە!

ووتم: کچی دەوڵەمەندە...!

ووتی: کەوایە چۆن عاشقی بووی! ئەزانی ئێمە کێین لەم کۆمەڵگایە!

ووتم: بەڵێ ئێمە هەژارین!

ووتی: کە ئەمە دەزانی چۆن عاشق بووی!

ووتم: خۆشم نازانم چۆن عاشق بووم ئیتر دڵە نەفرەتیەکەمە عاشق بووە...!

" سەیری کردم و چاوی پڕ لە فرمێسک بوو ، ووتی

کورم ئێمە هەژارین پێویستە لەبیری بکەی ،

لە کۆمەڵگای ئێمە کچ نادەن بە هەژارەکان "



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە عاشق بم

خەیـاڵ

تاکە شتە بتوانی خۆشیەکانی ئەم

ژیانەی تیادا ببینی...

پێناسەی من بۆ خەیاڵ



## زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێب: یەکەم جارە عاشق بم

ژیـان

لە هیچ هیچترە ئەگەر

خۆشی و ناخۆشی نەبینیت...

پێناسەی من بۆ ژیان



زیرەك جەبار عەزیز (زیكۆ)

کتێبی: یەکەم جارە عاشق بم

خـۆزگـە

ئەو شتەیە کە بووە

بە ڕابردوو و ئاواتی پێ دەخوازین...!

پێناسەی من بۆ خۆزگە



زیرەك جەبار عەزیز (زیکۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

## بۆ جێت هێشتم!

خۆشەویستم! بۆ جێت هێشتم!
لەوکاتەی جێت هێشتووم!
لە مەیخانە مەشرووب دەنۆشم!
لە دووری تۆ دڵشکاو و خامۆشم!
لە دووری تۆ چرای تەمەنم خامۆش بوو!
وەرەوە بۆ لام خۆشەویستم!
دڵنیابە ئەمجارە بگەڕێیتەوە!
لە جاران زیاتر خۆشم دەوێیتەوە!



# زیرەك جەبار عەزیز (زیکۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

## تا مردن خۆشمدەوێی

خۆشەویستم من تا دوێنێ
ئەم دەزانی پێنووس بە دەستمەوە بگرم
بەڵام ئەمرۆ کە ئاشقی تۆ بووم
بۆیە پێنووس گرتن بە دەستمەوە زۆر ئاسان بووە
پێنووس ئەما هۆنراوەی بۆ تۆ پێ نەنووسم
پەڕ ئەما ناوی تۆ و وەسفی جوانی تۆی لەسەر نەنووسم
سەدان پەڕم پڕکرد لە باس کردنی خۆشەویستی من بۆ تۆ
بەڵام نەمتوانی ئەو ووشە و ڕستانەی لە دڵمە
بۆ تۆ هەڵی ڕێژمە سەر سەدان پەڕ
ئیتر ناتوانم بۆت بنووسم لەوە زیاتر
چونکە پێنووسەکەم وا خەڵاس دەبێت
تەنیا بۆت دەنووسم "تا مردن خۆشمدەوێی"



**زیرەك جەبار عەزیز (زیكۆ)**

**كتێبی: یەكەم جارە ئاشق بم**

## جەنابی یار

ئیتر نامەوێ بێ تۆ بژیم!

بێ تۆیم بەسە لەم ژینە تاڵە!

بێزار بووم لەم ژینە بێ تۆیە!

تکایە بگەڕێوە بۆ لاّم!

منیش مافی دڵخۆش بوونم لەگەڵ تۆ هەیە!

دەمەوێ ئەم مافەم پێ بدەی!

ئەگەر بۆ یەک چرکەش بێت!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێب: یەکەم جارە ئاشق بم

مەڵێ فەلسەفە لێ مەدە!

چونکە قسەی دڵ!

پڕە لە فەلسەفە!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

ئەگەر تووشی لەبیرچوونەوەش بم

دڵنیابە لەبیرت ناکەم چونکە

تۆ لە دڵمی نەک لە مێشکم...!





## شازادەکەم

لای من چاوەڕێ کردنی تۆ!
کە خۆشم ئەوێیت....!
جوانترین شتی ئەم دنیایەیە!
ئەگەر چی دڵنیاشم کە نایەیت!





ئەگەر ویژدانت نەبێ!

هەموو شتێکی بەس مرۆڤ نەبێ..!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە عاشق بم

ئەگەر دانان بە ڕاستەیەکان

گەمژەییە ، ئەوە من گەمژەم...!



زیرەك جەبار عەزیز (زیکۆ)

کتێب: یەکەم جارە عاشق بم

لە وڵاتێکدا دەژیم..!

نەبوونی کەپڵ بۆتە عەیبە!

بەڵام نەبوونی ڕەوشت بۆتە پۆز!





ژینی من بۆ تۆ شازادەکەم....

چونکە من ژینێکم بێ تۆ ناوێ...







شازادەکەم

درۆیە بڵێم بێ تۆ ناتوانم بژیم!

بەڵام ژیانم بێ تۆ زۆر ناخۆشە!





ژیان قورس مەکەن..!

ژیان پێویستی بە دڵێکی سادە و گەورەیە..!

کە پڕ بێت لە خۆشەویستی..!



ئەگەر دوێنێ هەڵەم نەکردبا!

ئەوەی ئەمرۆ فێر نەدەبووم...!

بۆیە هیچ کات لە هەڵەکان پەشیمان مەبە!

بەڵام پەندی لێ وەرگرە و دووبارەیان مەکەوە!





تۆ پێش مرۆڤ بوون

پێویستە بەویژادن بیت...




زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)


کتێبی: یەکەم جارە عاشق بم

ژیانی من و زۆربەی گەنجانی وڵاتەکەم

درامایەکی دووبارەیە چونکە هەموو

ڕۆژ هەمان ئەڵقە دووبارە دەکاتەوە..!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

خۆشەویستم

کە مردم مەیە بۆ سەر

گۆڕم و گوڵم بۆ بێنی و باسی

یادگاریەکانمان بکەی ، ئێستا

وەرە بۆ لاَم گوڵم بۆ

بێنە و باسی یادگاریەکانمان بکە...!!



زیرەك جەبار عەزیز (زیكۆ)

کتێبی: یەکەم جارە عاشق بم

ئەی دەریا...!

تۆش بەقەدەر من ماسی درۆزنت هەیە

کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەیان ووت بێ تۆ

ناژین بەلام چوون بۆ شوێنێکی تر و لە

ژیان بەردەوام بوون...!!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە عاشق بم

خۆشەویستی تۆ!

خۆشەویستی خۆمی لەبیر بردمەوە!





ئەگەر ئەقڵت هەبوو ، بەکارت

نەهێنا وا داینێ نیتە...!





شازادەکەم

خۆشی ژیان بە من چی؟

کە تۆ لای من نەبیت!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

شازادەکەم

جوانترین شت لە دونیادا تۆی....



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)



مرۆڤەکان

تەنیا ئەوکاتە قەدریان دەبێت

کە چوون بۆ ژێر زەوی...!





له وڵاتێک دا دەژیم...!

مرۆڤه ئاقڵەکان خۆزگه به مرۆڤه

شێتەکان دەخوازن ، بەهۆی

نەریته سەقەتەکانی کۆمەڵگا...!!!





## کـــات

ئەو کاتە لای من گرینگە کە لەگەڵ تۆ بم...!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

پێشمەرگە

لە کوێ بێت ژیان لەوێیە

وە ئەو شوێنە نیشتیمانی منە...!





رۆژە خۆشەکان ناگەرێنەوە

بەڵام

هەمیشە رۆژە ناخۆشەکان دووبارە دەبنەوە....!





شازادەکەم

بڕوام بە هیچ پۆست بەرێک نیە...!

دەنا دەمێک بوو دڵی خۆمم بۆ ناردبووی...!



# مرۆڤ

كە هیچ ڕقێکی لە دڵ نییە لەگەڵ

بەرامبەرەکەی زۆر باشە

بەڵام ڕقێکی بچووک لە دڵی بێت

ئەوە لای ئاساییە بەرامبەرەکەی

بە دڕندەترین شێوە لەناو بەرێت...!

منیان بە کوشتنی کەسێک تاوانبار کرد

چونکە دەستم بۆنی خوێنی لێدەهات ،

بەڵام کەس بیری لەوە نەکردەوە کە لەوانەیە

بڕینی کەسێکم تەداوی کردبێ.... !





شازادەکەم

وەرە بۆ لام هیچ قسەیەک ناکەم

تەنیا گوێت بخە سەر دڵم و گوێ

لە ترپەکانی دڵی خۆت بگرە...



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

ژیانێکی زۆر سەیرە..!!

ڕۆژێک ئاوات بە مردن دەخوازین!

ڕۆژێک ئاوات بە ژیان دەخوازین!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە عاشق بم

# کـچ...!

# نیعمەتێکە خودا نایدات بە هەموو کەس!





شازادەکەم

هەموو کەس هۆکارێک یان ئامانجێکی

هەیە بۆ ئەوەی بژی!

هۆکار و ئامانجی من بۆ ژیان تەنیا

گەیشتنە بە تۆ!





من لەژیانی خۆم بۆخۆم گرنگ نیم!

بەڵام ڕەنگە کەسانێک هەبن

پێویستیان بە من بێت!

بۆیە پێویستە دژی ئەم ژیانە

دڕندەیە بجەنگم و سەرکەوتوبم!

بۆ ئەو کەسانەی کە پێویستیان بە منە!!



زیرەك جەبار عەزیز (زیکۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

شازادەکەم

تۆ پێناسەی بۆ ژیانی من...





شازادەکەم

لە ئەشقی من دا یاسایەک هەیە ئەو

یاسایەش ئەوەیە هەرچەند لەگەڵت بم

زیاتر خۆشم دەوێی و ئاشقت دەبم...





کاتێک دوو دڵ تێکەڵ

بە یەک بوون ئاشق بە یەک بوون!

ئیتر ڕوخسار و سامان هیچ بەهایەکی نامێنێ..!





شازادەکەم

هەرچی ووشەی دونیا بوو دەربارەی جوانی..!

کۆمکردەوە و لە پەرتوکێک نووسیمەوە...!

بەڵام نەمتوانی وەسفی جوانی تۆی پێ بکەم...!

تۆ زۆر لەوە جوانتری بە ووشە وەسفت بکەم...!





چاوەڕوان کردنی کەسێک زۆر تاڵە!

بەڵام ئەگەر بەرهەمەکەی

هاتنی تۆ بێت زۆر شیرینە..!





ووتم دەڕۆم!

هیچی قسەیەکی نەکرد!

ڕۆشتم زۆر سەیری دواوەم کرد!

بۆ ئەوەی بڵێ مەڕۆ!

بەڵام هەر نەیوت مەڕۆ!





زۆر نادوێم بەس دەڵێم

خۆشم دەوێی تا مردن

تۆش کەیفی خۆتە!





پیـاو

ئەوەندەی گرنگی بە پارە دەدات

گرنگی بە هاوسەرەکەی بدات

هەرگیز هاوسەرەکەی خیانەتی لێ ناکات





ئافــرەت

ئەوەندەی گرنگی بە قسەی خەڵک دەدات!

گرنگی بە هاوسەرەکەی بدات!

هەرگیز هاوسەرەکەی خیانەتی لێ ناکات!





هێی پیـاو

بە جگەرە کێشان کەس نەبووە بە پیاو!

تۆش واز لەو جگەرەیە بێنە!

سوجدەیەکی پاک بۆ خوداکەت ببە!

تا خەمت لە دڵ نەهێڵێت...!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

کەس بێ کەس نامرێت!

تەنیا یەکێکیان بۆ ئەوەی تر!

لە ناخەوە دەمرێت!



زیرەك جەبار عەزیز (زیکۆ)

کتێبی: یەکەم جارە ئاشق بم

ئیمە بیر لە کەسانێک دەکەینەوە!

ئەوانیش نەک بیر لە ئێمە ناکەنەوە!

بەڵکو ئێمەیان بەخەیاڵ نایەت!



زیرەك جەبار عەزیز (زیگۆ)

کتێبی: یەکەم جارە عاشق بم

بۆ بوون بە کەسێکی مەزن!

پێویستت بە خوێندنەوەی ئەزموونی کەسانی ترە!





ژیانی من!

بریتییە لە ناسینی تۆ!

هۆگر بوون و ئاشق بوون بە تۆ!

ماڵئاوای و مردن لەدوایی تۆ!





ئەگەر کەسێک لەپێناو تۆ

خیانەت لە کەسێک بکات!

پێویستە هەمیشە بترسی نەوەک

ئەمجارە خیانەت بەرامبەر تۆ بکات!!

# سوپاس بۆ هەڵبژاردنی ئەم کتێبە




## بۆ دەست کەوتنی ئەم کتێبە
## سەردانی ئەم ئەدرەسانە بکە

Facebook: Zirak Jabar Aziz

Link: https://www.facebook.com/ZKURDHD

Instagram: Zirak_Jabar_Aziz




تێبینی:- لە کاتی بردنی هەر بابەتێکم وەک ڕێزێک لە ماندووبوونم ناوم لەگەڵ بابەتەکە بنووسە زۆر سوپاس بردنی بابەتی نوسەرێك بێ ناوی نوسەر کارێکی زۆر ناشرینە بەڕای خۆم بۆیە لەکاتی بردنی بابەتەکانم یان بابەتی هەر نووسەرێك ناوی نوسەر بنووسی کارێکی زۆر جوانە .... "سوپاس بۆ خوێندنەوەی بابەتەکانم"

